**پێناسی کتێب :**

**ناوی کتێب :** بۆچی هاوسەرگیری دەکەیت ؟

**ناوی نوسەر :** کۆسار عرب هەورامی

**بابەت :** گەشەپێدانی مرۆیی

**دیزاینی بەرگ و ناوەرۆک :** سەیوان ئەحمەد ڕەشید

# پێشەکی

**( بۆچی هاوسەرگیری دەکەیت )**

**ئایا هەرگیز ئەم پرسیارەت لەخۆت کردوە ؟**

**ئایا هەرکات کات بیرۆکەی چونە ناو ژیانی هاوسەری بە مێشکدا هاتبێت ئەم پرسیارەت لە خۆت کردوە ؟**

**ئایا گەر هاوڕێیەکت یاخود ئەندامێکی خێزانەکەت نیازی هاوسەرگیری کردنی هەبووبێت هیچ کات ئەم پرسیارەت لێ کردوە ؟**

**کاتێك کە مرۆڤ کردەوەیەك بە خواست و ویستی خۆی ئە نجام دەدات ناکرێت نەزانێت هۆکار و پاڵنەرەکەی بۆ ئەو کارەی کە دەیکات چییە !**

**گەر ئەم پرسیارەت لە خۆت نەکردوە کەوایە بوەستە !!**

**بوەستە لە یاریکردن بە هەستی بەرامبەرەکەت .**

**بوەستە لە بەستنی پەیوەندی لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەرەکەت بەبێ هۆ.**

**بوەستە لە خۆ فریودان .**







**بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە هەندێك بیر و ڕاو پاڵنەری چەند گەنجێکی شارەکەم بۆ پرۆسەی هاوسەرگیری بۆ تۆی ئازیز دەخەینە ڕوو.**







**(گە نجێکی موسڵمان و ئیماندار زۆر هەوڵی دەدا و دەیویست هاوسەرگیری بکات بۆئەوەی داوێنی خۆی بپارێزێت و توشی زینا نەبێت )**




کاتێک ئێمە تەنیا لەبەر سێکس هاوسەرگیری دەکەین ، ئەوپەڕی ئەوپەڕی بەرگە گرتنی ژیانمان ساڵێک یان دوو ساڵە ،پاشان لەبەرچاو دەکەوین و دەبێزرێین ،چونکە ڕەگەزی نێر ڕەگەزێکی ڕاوکەرە ،ڕەگەزی مێیینەش ڕەگەزێکە تایبەتمەندی نێچیری هەیە و دڵبەری دەکات ،بۆ نمونە ئەگەر خانمێک بێت و لەبەر دەمتدا چۆک دابدات و پێت بڵێت ئازیزم توخوا هاوسەرگیریم لەگەڵ بکە ،من تۆم خۆش دەوێت و من بۆت دەمرم ... ئیتر ئەو خانمە لەبەر چاوی پیاوان دەکەوێت یان ئەگەر پیاوێکیش بە پێچەوانەی هەڵسوکەوتی ڕاوکەرانە هەڵسوکەوت بکات دیسان لەبەرچاوی خانمان دەکەوێت ،بۆچی؟ چونکە لە پشت ئەم ڕووداوانە چەند تەدبیرێک خۆیان حەشار داوە ،ئەم تەدبیرانەش ئی سەردەمێکن کە ئێمە وەکو ئێستا پێشکەوتوو نەبوین ،چل پەنجا هەزار ساڵ لەمەوبەر ئەو سەردەمە ئێمە وەکوو کێوی دەژیان بەڵام هەر ئەو تەدبیرانەن کە ئەمرۆ من و ئێوەش بەڕێوە دەبەن .





هاوڕێ گیان گەر پاڵنەری تۆ بۆ هاوسەرگیری تەنها  بۆ پارستنی داوێنت

و ئەو حەزە جنسیەت  بێت ئەوە بزانە کە تۆ هەڵەیت .

بەڵێ هاوڕاتم کە کارێکی باش دەکەیت و خۆت لە گوناح و کاری نابەجێ بەدوور دەگریت , بەڵام ناکرێت تەنها و تەنها ئەم هۆکارە بکەیتە  پاڵنەری سەرەکی بۆ هاوسەرگیریەکەت ,

چونکە هاوسەرگیری زۆر لەوە گەورەترە کە تۆ بیرت لێ کردوەتەوە .

هەروەها ئەوەی تۆ هەنگاوی بۆ دەنێیت تا سەر بۆت نامێنێت بەڵکو بە پێی بارودۆخەکانی ژیان و بارودۆخەکانی ڕەگەزی بەرامبەرت کەم دەبێتەوە یاخود هەر نامێنێت ؛

باشە با من پرسیارێك لە تۆی ئازیز بکەم ؟

گەر تۆ هاوسەرگیریت کرد و هاوسەرەکەت کەوتە سوڕی مانگانەوە یاخود نەخۆش بکەوێت

**ياخود توشى هەر حاڵتێك ببێت كە تۆ نەتوانيت لەگەڵى ڕابوێريت و حەزە جنسيەكەى خۆتى لەگەڵدا ئە نجام بدەيت كە بىٚ گومان ئەم حاڵەتانە لە ژيانى هاوسەريدا دێتە سەر ڕێت دەتونيت پێم بڵێيت كە تۆ حاڵتێكى لەو شێوەيە هاتە سەر ڕێت چى دەكەيت ؟**

**دەڕۆيت زينا دەكەيت و داوێنت پيس دەكەيت ئەوەى**

**كە بۆ خۆپاراستن ليێى هاوسەرگيريت كرد ؟!**

**دەڕۆيت هاوسەرگيرى لەگەڵ كەسێكى ديكەدا دەكەيت ئەويش گەر لە توناتدا بێت ؟**

**ياخود دان بە خۆتدا دەگريت و بەسەر نەفسى خۆتدا زاڵ دەبيت ؟**

**كەواتە دەرونيەن تۆ ئێستا حاڵت باش نيە ,**

**چونكە كەوتويتەتە بەردەم سىٚ ڕێگا چارە و وە جارێك نيە و دووان نيە**

**و دەيان نيە و سەدەها جار نيە كە تۆ دەكەويتە**

**بەردەم ئەم سىٚ ڕێگا چارەيە و بەڕاستى پێت بڵێم ژيان بەو شێوەيە بەڕىٚ ناكرێت هاوڕىٚ گيان .**

گەر ڕێگەی یەکەم هەڵبژێریت ئەوا تۆ سەر کەوتوو نەبوویت

و نەگەیشتیت بە هیچ چونکە ئەوەی لێی دەترسایت و لێی ڕات دەکرد

کە داوێن پیسیەکە بوو توشی بوویت .

ڕێگای دووەمیش بۆ هەموو کەسێك ناچێتە سەر

, چونکە ئاسان نییە بەو خێراییە هاوسەرگیری دووەم بکەیت

هەم لە ڕووی یاساوە و هەم لە ڕووی شەریعەتی ئیسلامیەوە کۆمەڵێ

مەرجی خۆی هەیە .

سەبارەت بە ڕێگای سێیەمیش گەر محاڵ نەبێت ئەوا قورسە بۆ کەسێکی

وەك تۆ

کە پاڵنەرەکەت بۆ هاوسەرگیری ئەو حەزە جنسییە و سێکس بووە .

بۆ ئەو هاوسەرانەی کە تازە ژیانیان پێکەوە ناوە گەر بانگم بکەن

بۆ زەماوەندەکەتان لەوێدا ئەمەتان پێ دەڵێم :

ئاگاتان لەوە بێت کە لە سێکسدا زیادەڕەوی مەکەن چونکە قۆناغی

یەکەم قۆناغی غەریزەیە ، ژن و مێرد پێیان وایە هەرچی سێکسیان

پێکەوە زیاتر بێت ،زیاتر یەکیان خۆش دەوێت ،کەبابیش زۆر

بخۆیت لێت دەبێزرێت و ناتوانی بیخۆیت پاشان دەست دەکەن بە

دوری کردن لەیەک و بۆ ئەوەی ئەو دوری مەودایە بشارنەوە زیاتر سێکس دەکەن دیسان پەیوەندیەکان خراپتر دەبێت .

ئێمە دەبێت وەک مرۆڤێکی عاقل لە هاوسەرگیریدا شتانێکی گەورەتر لە سێکس ببینین .چەمکی تازە و مانای قوڵتر هەیە کە پێویستە لە ژیانی هاوسەریدا پێی ئاشنا ببین .

( گە نجێك هۆگر و پەیوەست بوو بوو بە هاورێ کچەکەیەوە و نەیدەتوانی یەك کاتژمێریش بەبێ قسە کردن لەگەڵی تێبپەڕێنێت

و دەیویست هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات )




منیش بەم هاورێ ئازیزە دەڵێم کە من هۆگر و پەیوەستی کۆمپیتەرەکەم بووم ,

دەبێت هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم ؟!؟!!

دەڵێم کە منداڵێکی 7 ساڵان هۆگر و پەیوەست بووە بە دایکیەوە

ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە دەبێت هاوسەرگیری

لە نێوان ئەو منداڵە و دایکیدا ڕووبدات ؟!





**ئایا ئەمانەی کە من وتم دەچێتە عەقڵی منداڵ و شێتێکیشەوە ؟!**

**بە دڵنیایەوە نەخێر .**

**وە هەروەها زۆربەی دەروناسان هۆگر بوون**

**و پەیوەست بوونی کچ و کوڕ بە جۆرێك لە نەخۆشی دەروونی ناو دەبەن .**

( گەنجێك کچێکی جوان و سەرنج ڕاکێشی بینی لە هەمان ئەو زانکۆیەی کە خۆی لێی دەخوێند وە دەیویست ئەم خانمەی لە دەست دەر نەچێ و بە زووی هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات )





**ئەم گەنجە چوە داوای ئەو خانمەی کە چاوی پێکەوتبوو لە زانکۆکەی خۆیدا**

**خێزانی خانمەکە بە هەر هۆکارێك بێت ڕەزامەندیان دەرنەبڕی کە کچەکەیان هاوسەرگیری لەگەڵ ئەم کوڕەدا بکات**





دوای هەوڵ و ماندو بوونێکی زۆر و قسەکردن لەگەڵ خێزانی ئەم خانمە توانی ڕەزامەندیان بەدەست بێنێت و هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەیاندا بکات و چوونە ژیانی هاوسەری خۆیان

دوای ماوەیەکی کەم ! چەندەها کێشەو گرفتیان تووش بوو تا کار گەیشتە ئەوەی سەردانی دادگایان کرد بە مەبەستی لێك جوودابوونەوە!!

پاشان کوڕەکە گەڕایەوەماڵەوە و لە سوچێکی ژوورەکەیدا دانیشتبوو لەبەر خۆیەوە دەیگوت: خۆ هەموو شتێك باش بوو خانمێکی جوان بوو بۆ وامان بەسەر هات !

منیش بەم هاوڕێ ئازیزە دەڵێم : هیچ سەیر نەبێت بە لاتەوە و تووشی شۆك نەبیت لە هیچ کام لەو ڕووداوانەی کە بەسەرت هات چونکە تۆ دووجار هەڵەیت !

هەڵەی یەکەم : کەوتنە داوی جوانی ئەو خانمە و فەرامۆش کردنی کردار و ڕەوشتی ناخی خانمەکە .

هەڵەی دووەم : پەلە کردن بوو لە چوونە ژیانی هاوسەری و شەڕکردن لەگەڵ قەدەری خودا

**ئاخر هاوڕێی ئازیز هاوسەرگیری پرۆسەیەك نیە**

**كە تۆ بەم شێوە خێرایە دروستی بكەیت و كەسێك بكەیت بە**

**هاوژینی خۆت. زۆر جار دووكەس كاتێك هاوسەرگیری دەكەن دوای**

**چەندین ساڵ پاشان لەیەكتری تێدەگەن و یەكتری دەدۆزنەوە .**



**هەرگیز لە سەر بنەمای ڕوخسار تەماشای هیچ**

**كەسێك مەكە ! جوانترین مار ژەهراوی ترینیانە .**







( گە نجێك دەیویست هاوسەرگیری بكات تاوەكو هاوسەرێك پەیدا بكات بۆ ئەوەی دایك و باوكە پیر و پەككەوتەكەی بۆ بەخێو بكات و بە بەردەوامی چاودێریان بكات )



ئەوە بزانە هاورێ گیان كە هیچ دایك و باوكێك كچی خۆی بۆ ئەوە

پەروەردە و گەورە نەكردوە

كە تۆ هاوسەرگیری لەگەڵدا بكەیت بۆ ئەوەی وەك خزمەت كار و كۆیلە بەكار بهێنیت .

ڕاستە تۆ پێش ئەوەی مارەی بكەیت بە دڵنیایەوە پێی دەڵێیت

كە بۆ ئەو مەبەستە هاوسەرگیری لەگەڵدا دەكەیت وە ئەویش ڕەزامەندە ,

بەڵم تۆ لەوە بێ ئاگایت كە ئەم خا نمە هەموو

ڕۆژێك هەست بە بێ ڕێزی و كۆیلایەتی خۆی دەكات بەڵام دەری نابڕێت .

خۆ ئەگەر دەری ببڕێت بۆت ئەوا یەكەم قسەی تۆ ئەوەیە كە دەڵێیت :





من بۆ ئەو مەبەستە تۆم کردوە بە هاوسەری خۆم گەر بە دڵت نیە

فەرموو ئەوە دادگا و هەر کەس بە ڕێی خۆی !

ئەمە تۆ دوو جار ئەم خانمە ئازیزەت ماڵ وێران و سەرگەردان کرد.

باشە ئەمەی تۆ بەسەر ئەم خانمەت هێنا کام مرۆڤایەتی قبوڵی دەکات ؟

کام ئایینە قبوڵی دەکات ؟

کام دڵ بەرگەی دەگرێت ؟

کام ویژدانە ئازار نادات ؟

.

# ترس له قەیره بوون و مانەوه




کچێك له ترسی ئەوەی که له پرۆسەی هاوسەرگیری بەجێ نەمێنێت

و له ترسی قسەی کۆمەڵگا که پێی نەوترێت ( قەیره )

دەست بەجێ و کوێرانه بڕیاریدا هاوسەرگیری بکات .

باشه گوڵه باخ تۆ بێ ئاگایت لەوەی که هۆکاری دواکەوتنی تۆ له شوکردنت ئەوەیه

که خودای گەوره تۆی پاراستوه له پیاوی خراپ ؟

به جەهەنەم , کۆمەڵگا هەرچیەکت پێ دەڵێت گوێ مەدەرێ

گرنگ ئەوەیه که تۆ بەختەوەر بیت و دوور بیت له پیاوی خراپ.

چونکه ئەوەت له بیر بێت ئەوەی که هاوسەرگیری دەکات

و دەبێته دایك و خاوەن ژیانێکی تەواو جیاواز تۆیت نەك کۆمەڵگا .

ئەوەت پێ بوترێت زۆر باشتره لەوەی که کوێرانه هاوسەرگیری بکەیت

و پاشان لەگەڵ هاوسەرەکەت نەگونجێن





**و دوای بەخشینی دوو بۆ سێ منداڵ لەلایەن خوداوە لە یەکتری جودا ببنەوە**

**و بە کەسایەتیەکی ڕوخاوەوە بگەڕێیتەوە ناو کۆمەڵگە و قوربانی یەکەم و قورسترین باجی ئەو لێك ترزانە منداڵە بێنازەکان دەیدەن .**

**( کچ و کوڕێك بۆ ماوەیەکی زۆر پەیوەندی خۆشەویستیان بە یەکەوە هەبوو و عاشقی یەکتری بوبون بەنیاز بوون هاوسەرگیری بکەن و بەردەوامی بدەن بە خۆشەویستیەکەیان )**





خوێنەری ئازیز من لێرەدا بە پشت بەستن بە ئەو ئە نجامە خرا پانەی کە لە بەستنی پەیوەندی خۆشەویستی پێش هاوسەرگیریەوە دەکەوێتەوە و بەو چیرۆکە ناخ هەژێنانەی کە بەردەوام لەبەر گوێمانە و ئەو کەیسی لێك ترازانی خێزانیانەی لە بەردەستمانە و بە ڕاوێژکردن لەگەڵ پسپۆڕانی بواری ئایینیی و دەروونی و کۆمەڵایەتی لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان ئەم زانیاری و ئامارانە دەخەینە ڕوو و پاشان ڕاست و هەڵەی بڕیاری ئەو دوو گە نجە خۆشەویستە جێدەهێڵم بۆ خۆت :

سەرەتا کەسێک کاتێک کە عاشق دەبێت ،هەرچی پێ بڵێن لە هیچ حاڵی نابێت ،هەرچی پێی دەڵێن کاکە ئەمە بە کەڵکی تۆ نایات دەڵێت لێم تێناگەن ئێوە نازانن حاڵی من چۆنە ... ڕاستیش دەکات چونکە مادەیەک هەیە بە ناوی (ئۆکسی تۆسین) لە خوێندا بەرز دەبێتەوە گەر ئێستا بیدەن لە من و تۆ عاشق دەبین وە هەر ئەم مادەیە وادەکات کە داییک شیر بدات بە منداڵەکەی بەڵام تەنها





ئەوە بەسە کە ئێمە بۆ مانەوەی ڕەگەزی خۆمان هاوسەرگیری بکەین؟ بێگومان نەخێر

کاتێک ئێمە دەڵێین ەمانەوێت عاشقانە بژین مەبەستمان چییە ؟

ئایا مانای ئەوەیە هەرچی ئەو وتی من بڵێم تۆ ڕاست ئەکەیت یان بە پێچەوانەوە ،ئێستا کاتی ئەوە نیە کە ئێمە سەبارەت بە عەشق بە دوروو درێژی بدوێین بەڵام زۆر بەکورتی ئاماژەیەکی پێدەدەم ،پرسی عەشق واتە من زائیدەن تۆ یەکسانە بە ئێمە ،عەشق واتە ئێمە ،ئەگەر ئەم هاوکێشەیە بەهەرشێوەیەک تێک بچێت واتە گەر ببێتە من زائیدەن من دەبێت بە سفر یاخود تۆ زائیدەن تۆ ،هەرکاتێک یەکێک لەم من و تۆیە تێک بچێت عەشق دەروات و دەبێتە جۆرێک لە نەخۆشی دەروونی ،نابێت دەسەڵات خوازی و فەرمان کردنمان لێ ببێت بە عەشق و پلەبەندی عەشق ئەوە نیە لەسەرەوە بێت بەرەو خوارەوە ، لە خوارەوە دەست پێدەکات بەرەو بالایی .پێویستە کوڕو کچە گەنجەکانمان بزانن کاتێک کە عاشق دەبن ئیتر بەدەست خۆیان نییە ،لێرەدا دەبێت گوێ لەم قسەیە بگرن : لە یەکێک لە ئەفسانەکانی یۆنان پێم وایە (ئۆلیز) بووە ،ئەو زۆر حەزی لەوە بوو کە سەردانی دوورگەی (سیرینەکان) بکات ،سیرینەکان کەسانێک بوون جۆرێک لە شەیپور(دەهۆڵ)یان لێدەدا

که خەڵکی پێیان خۆش بوو ،کاتێک کەشتیەکان دەهاتن بەرەو ئەو دوورگەیە تا گوێ لەو دەنگ و ئاوازە ئەفسوناییە بگرن ئەوانیش بەدیلیان ئەگرتن و کەلوپەلەکانیان دەبردن و دەیان کوشتن !
ئۆلیزیش بڕیاریدا کە حەتمەن دەبێت بچێت بۆ ئەو دوورگەیەو گوێ لەو ئاوازەی سیرینەکان بگرێت بەڵام پێی دەڵێن کە گوێی لێ نەگرێت ،چونکە مەست دەبێت و ئاگات لەخۆت نامێنێت و دەڕۆیتە ناویانەوە و پاشان دەتکوژن .ئەمیش فەرمان بە مەلەوانی کەشتیەکە دەکات کە تەواوی مەلەوانەکان مۆمیان بکەنە گوێیانەوە بەشێوەیەک کە گوێیان لە دەنگی سیرینەکان نەبێت ،ئینجا دەڵێت من بە ستونی کەشتیەکە ببەستنەوە تا نەتوانم هیچ شتێک بکەم وە دەمیشم ببەستنەوە تا نەتوانم فەرمان بکەم ئینجا بە تەنیشت دوورگەی سیرینەکاندا تێدەپەرین ، چونکە من بەو جۆرە من دەنگی سیرینەکان دەبیستم و ناتوانم هیچ بڵێم و هیچ بکەم ،ئێوەش نابیستن و ئەتوانن کاری خۆتان بکەن ،بەمشێوەیە توانی دەنگی شەیپورەکە ببیستێت و بە تەنیشت مەترسیەکە تێبپەرێت ،تۆش پێویستە هەرکات ویستت هاوسەرگیری بکەیت ، بۆ ئەوەی نەکەویتە داوی هەست و سۆزەوە بە جۆرێک خۆت بە ستونێک ببەستەوە و کارێک بکە کەس گوێی لە قسەکانت نەبێت بۆ ئەوەی بتوانی بڕیاری دروست بدەیت ناڵێم نابێت ئحساست هەبێت

،ئحساست گرینگە بەڵام دەبێت ئاگات لەم خاڵە بیێت کە نەبیت بە قولاپی ڕاوچی هەست و سۆزەکانتەوە . لە هاوسەرگیریدا دەبێت بە عەقل بڕیار بدەیت چونکە کاتێک ئاگری هەست و سۆز کلپەی سەند ئیتر ناتوانی بەرامبەری ڕابوەستی و شەڕی لەگەڵ بکەیت

( ئایا تا چەند دڵنیایی ئەوە بە خۆت دەدەیت

کە ئەو خۆشەویستییەی پێش هاوسەرگیری درووستی دەکەیت

دوای هاوسەرگیریش هەر دەمێنێت ؟ یاخود کەم دەبێتەوە ؟ یانیش هەر

نامێنێت ؟ ).





توێژەرێکی زۆر زیرەك و بە توانای بە ڕە گەز فەڕەنسی دەگێڕێتەوە

کە لە کاتی گەشتکردنی بۆ وڵاتێکی دیکە بە مەبەستی

پێشکەشکردنی سیمینارێك بۆ هاوسەران, لە ناو فڕۆکەکە لە تەنیشتی خۆیەوە

پیاویکی بەساڵاچوو زۆر سەرنجی دەدات کە





ئەم توێژەرە خەریکی نووسینە و جلوبەرگێکی زۆر ڕێکی

لەبەر دایە و بە سەر و سیمایدا دیارە کە یان مامۆستایە یاخود

کەسێکی دانا و بلیمەتە ,

بۆیە ئەم پیرە پیاوەش خۆی پێناگیرێت

و دەست بەجێ دوای سڵاو کردن پرسیاری لێ دەکات و دەڵێت : بەڕێز تۆ

چ کارێك دەکەیت ؟

لە وەڵامدا دەڵێت : من توێژەری کۆمەڵایەتیم و شارەزاییشم لە بواری

دەروون ناسیدا هەیە

و ڕۆژانە لە کۆڕ و بەرنامە تەلەڤیزۆنیەکان و ئەکاونتی تایبەتی

خۆمەوە سیمینار بۆ هاوسەران پێشکەش دەکەم

و ئامۆژگاریان دەکەم کە چۆن بتوان بەردەوام خۆشەویستی نێوانیان

زیاد بکەن

و چۆن بتوانن بەسەر کێشە و ئاستەنگەکانی ژیانی هاوسەریدا

سەربکەون و ئەمانە و چەندین ئامۆژگاری دیکە بۆیان .

پیرە پیاوەکەش دەڵیت : ماوەیەکی زۆرە من چاوەڕێی دەرفەتێکی

لەو شێوەیەم تاوەکو لە کەسێکی شارەزا بپرسم  کە ئایا چی بەسەر ئەو عشق و خۆشەویستییە دێت کە لە  پێش هاوسەرگیری درووست دەکرێت ؟

کە لەو کاتەدا ئامادەن ژیانی خۆشیان دابنێن لە  پێناو یەکتری

, چی بەسەر ئەو هەموو خۆشەویستیە دێت لە دوای ئەوەی ئەو دوو کەسە هاوسەرگیری دەکەن ؟

ئەم توێژەرە دانایەش زۆر سەڕی سوڕما لەم پرسیارەی ئەم پیرە  پیاوە

کە ئاخۆ پیرە یاوێك کەلە لێواری مەرگدایە چ کاری بەم پرسیارەیە !

تۆ بڵێی ئێستا لە کاتی بەستنی پەیوەندی خۆشەویستیدا بێت ؟
یاخود بە نیاز بێت خۆشەویستی لەگەڵ کەسێکدا بکات ؟!!!

بۆیە بە تاسەوە پێی گووت مامە گیان بۆچی ئەم پرسیارە دەکەیت ؟!

پیرە پیاوەکەش گووتی : کوڕی خۆم من تاوەکو ئێستا سێ جار هاوسەرگیریم کردوە

یەك لە دوای یەك لە هەر سێ جارەكەدا لە پێش پێك هانانی ژیانی هاوسەری پەیوەندیەكی پڕاوپڕ لە خۆشەویستی لەنێوا نماندا هەبوو ,

بەڵام لەدوای هاوسەرگیریكرد نمان هەموو شتەكان لە هەست و سۆز و متمانە و ڕاستگۆی و لێك تێگەیشتن سەرجەمیان بە تەواوی پێچەوانە بوونەوە !

هەموو ئەو خۆشەویستییەی كە بۆ یەكمان هەبوو بوون بە بڵقی سەر ئاو !

توێژەرەكەش پرسیاری لێ دەكات كە ماوەی مانەوەی

لە ژیانی هاوسەریدا لەگەڵ هەر سێ هاوسەرەكەی چەندە بوو ؟

پیرە پیاوەكەش لە وەڵامدا گووتی : هاوسەرگیری یەكەمم بۆ ماوەی 6 ساڵی خایاند

هاوسەرگیری دووەمیش بۆ ماوەی 3 ساڵ بەیەكەوە بووین .

هاوسەرگیری سێیەمیشم بۆ ماوەی نزیكەی یەك ساڵ بەیەكەوە بووین .

توێژەرەكەش پرسیاری لێكرد كە ئایا خۆشەویستیەكەتان

ڕاستەوخۆ دوای هاوسەرگیریکردنتان کۆتای دەهات یاخود

هێدی هێدی و لەسەرخۆ کەم دەبوویەوە پاشان کۆتای پێ دەهات ؟

لەوەڵامدا گووتی : لە هاوسەرگیری یەکەممدا نزیکەی سێ بۆ چوار سالْ بەخۆشی بەیەکەوە بووین و وە بەر لە هاوسەرگیریش نزیکەی 9 مانگ پەیوەندی خۆشەویستیمان هەبوو

هەموو شتێك زۆر باش بوو ,

واتە پێش هاتنە دوونیای منداڵەکەمان

دوای هاتنە دوونیای منداڵەکەمان وا هەستم دەکرت کە هاوسەرەکەم تەنها گرنگی بە منداڵەکەمان دەدات و

وا دەردەکەوت کە من چیتر بۆی گرنگ نەبم , وادەردەکەوت کە تاکە هیوای ئەو لە ژیاندا منداڵێك بوویێت, وە لە دوای هاتنە دونیای منداڵەکەش چیتر پێویستی بە من نەمابێت .

توێژەرەکە پرسیاری لێی کرد کە ئەم قسە و گوومانانەی دڵی خۆت هیچ کات بۆ هاوسەرەکەت باس کردوە ؟

ئەویش گوتی بەڵێ بە دڵنیایەوە .

بەڵام ئەو لە وەڵامدا بە منی دەگووت : کە من شێت بووم ! هەروەها دەیگوت کە گوایە من لەو فشارە تێ ناگەم کە کەوتوەتە سەر شانی ئەو بەوەی کە 24 کاتژمێر سەرقاڵی چاودێری و خزمەت کردنی منداڵەکەمانە ,

دەیگووت کە پێویستە من زیاتر لەو تێبگەم و هاوکاری بکەم.

لەڕاستیدا من هەوڵم دا زۆریش ,

بەڵام وا پێدەچوو کە هیچ جیاوازیەك چەکەرەی نەکردبێت لە نێوا نماندا

تا دەهات زیاتر و زیاتر لەیەکتری دوور دەکەوتینەوە و

ئیدی ئەوەی پیچی بوترێت خۆشەویستی لەنێوا نماندا نەما و

هەردووکمان لەسەر ئەوە کۆك بووین کە پەیوەندی نێوا نمان کۆتای پێ هاتووە

و بە مەبەستی لێك جیابوونەوە سەردانی دادگامان کرد و کۆتا یمان بە ژیانی هاوسەری هێنا و

لەم نێوەندەشدا زەرەر مەندی یەکەم منداڵێکی بێ تاوان بوو .

**هاوسەرگیری دووەمم هەر لە سەرەتاوە هەرەسی هێنا و نازانم چی ڕوویدا , من پێم وابوو کە ئێمە یەکتریمان زۆر خۆش دەویست و تەنانەت پێش هاوسەرگیری کردنمان بۆ ماوەی دوو ساڵ پەیوەندی خۆشەویستیمان لەنێواندا بوو ! بەڵام مانگی هەنگوینیمان بۆ خۆی کارەساتێك بوو کە دوای ئەوە هەرگیز پەیوەندیمان ئەو گەرم و گوڕ و پڕ لە سۆز و خۆشەویستییەی بەخۆوە نەبینی .**

**لە کۆتا هاوسەرگیریشمدا , وا بیرم دەکردەوە کە لەوانەی پێشووم جیاواز بێت ماوەی سێ ساڵ دەبوو کە لە هاوسەری پێشووم جیابووبووبەوە وە نزیکەی یەك ساڵو نیو پەیوەندی خۆشەویستیمان لەنێواندا هەبوو , وا بیرم دەکردەوە کە یەکەم جار بێت کە خۆشەویستی کەسێك بە تەواوی مانای خۆشەویستیەوە مانای چی دەگەیەنێت , وا هەستم دەکرد کە ئەو خۆشەویستی ڕاستەقینەی بۆ من هەیە .**

**وە لەدوای هاوسەرگیری کردنمان پێم وانیە کە گۆڕابم و خۆشەویستیەکەم بەرامبەر ئەو کەمی کردبێت ,**

بەردەوام و بەهەمان شێوەی پەیوەندیە خۆشەویستیەکەی پێشوومان خۆشەویستیمان بۆ یەکتری دەردەبڕی و پێم دەگووت کە من چەند بەختەوەرم کە هاوسەری ئەوم .

بەڵام لە دوای چەند مانگێك لە ژیانی هاوسەریمان ئەو دەستی کرد بە بیانوو گرتن لە کۆمەڵێ شتی بێ بایەخ و هیچ وەك , من خۆڵ و خاشاك نابەمە دەرەوە و جلەکانم هەڵناواسم و دواتر ئەمانە سەری کێشا بۆ زۆر شتی دیکە وەك هێرشکردنە سەر کەسایەتیم بەوەی کە ئەو ناتوانێت متمانە بە من بکات , بەتەواوی بوو بوو بە کسێکی نەرێنی , بۆیە کار گەیشتە ئەوەی کە هەردووکمان لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە پێکەوە بوونی ئێمە چیتر هیچ سوودێکمان پێ ناگەیەنێت لەبەر ئەوە لە یەکتری جوودا بووینەوە .

ئێستا پرسیاری من ئەوەیە : چی بەسەر ئەو خۆشەویستییە دێت لە دوای هاوسەرگیری ؟

**ئایا کەسانی تریش بە هەمان ئەزموونی ژیانی مندا تێپەڕ دەبن ؟**

**ئایا هەر ئەمەیە کە وا دەکات ڕێژەیەکی زۆر لە جیابوونەوە لەنێوان هاوسەراندا ڕوودات لە وڵاتەکەمدا؟**

**ئەوانەی کە جیانابنەوە فێری ئەوە بوون کە چۆن بەبێ بوونی هیچ خۆشەویستیەك بژین ؟**

**ئایا کەسانێك هەن کە خۆشەویستی لە ژیانی هاوسەرییاندا بوونی مابێت ؟**

**ئەم پرسیارانەی ئەم پیرە پیاوە هەمان ئەو پرسیارانەن کە چەندەها خێزان و ئەوانەشی لێك جیابوونەتەوە بە بەردەوامی لێمی دەکەن , هەندێکیان پرسیار لە هاوڕێ نزیکەکانیان دەکەن**

**هەندێکیان پرسیار لە ڕاوێژکار و توێژەر و زانایانی ئایینی دەکەن .**

**هەندێك جار وەڵامەکان بە هەندێ دەستەواژەی نا باو لە لێکۆڵینەوە سایکۆلۆژیەکاندا ئاماژەیان پێکراوە کە کەسانی ئاسای ناتوانن بە**

ئاسانی لێیان تێبگەن , هەندێ جاریش وەڵامەکان بەشێوەی فۆلکلۆری یاخود بەشێوەی گاڵتە ئامێز دەخرێنە ڕوو , زۆربەی نوکتە و پەندەکان بەشێك لە ڕاستیەکان دەخەنە ڕوو بەڵام ئەمە وەك ئەوە وایە کە (ئەسپرین) بۆ کەسێك پێشنیار بکەی بۆ کەسێك کە تووشبووی نەخۆشی( ژێر پە نجەیە ) .

ئەم پیاوە بەساڵاچووە پرسیاری کرد کە

ئایا چی بەسەر ئەو خۆشەویستیە دێت لە دوای هاوسەرگیری ؟,

من بەم مامەیە و گە نجانی خۆشەویست دەڵێم کە بێ گومان بن لەوەی ئەو هاوسەرگیریانەی کە لە سەرەتادا بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ پەیوەندی بەناو

خۆشەویستی و عیشقیان لەنیواندا هەبووە و

زۆربەیان لە ژیانی هاوسەریدا

سەرکەوتوو نابن چونکە زۆرێك لەو بابەت و دەردە

دڵانەی کە پێویستە لە ژیانی هاوسەریدا ڕۆژانە قسەی

لەسەر بکرێت ئەوا ئەوان لەوەو پێش هەموو

شتێکیان بڕانووەتەوە و هیچ شتێك نەماوەتەوە بۆ وتن و شەو و ڕۆژیش بەبێ قسەکردن ناڕوات هاوڕێ گیان , وە هەروەها باسکردنی بابەتە سێکسیکان

بەیەکەوە و وروژاندنی هەستی یەکتر و زۆرجاریش ئەم باسکردنە سەر دەکێشێت بۆ کردار و ئەو دوو کەسە تووشی کاری نابەجێ دەبن بەڵێ هەندێ جار پیاوان باکیان نیە لەم کارە بەڵام قوربانی سەرەکی ئافرەتانن کە هەندێ جار کچێنی خۆیان لەدەست دەدەن و گەر نەبێتە هاوسەری ئەو کەسەش ئەوا هەموو ژیانی بە ترسەوە بەسەر دەبات و ناتوانێت هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی دیکە بکات بە خواستی خۆی کە مافێکی سەرەکی خۆیەتی ,

وە وا لە هەردوو ڕەگەز دەکات هیچ کات متمانەیان بە یەکدی نەبێت و کەمبوونەوەی هاوسەرگیری لە وڵاتداو زۆر بوونی کاری بەد ڕەوشتی چونکە

گە نجەکا نمان بە ڕێگەیەکی دیکە حەزی جنسی خۆیان بەتاڵ دەکەنەوە کە لای ئەوان بە شتێکی درووست ناوی دەبەن بەڵام من و ئەو نمونانەی کە لە وڵاتەکەم

ڕوو دەدەن و زۆر جار لە زاری خۆیانەوە گوێمان لەو کارەساتانە دەبێت کە بەهۆی ئەم حاڵەتەوە ڕوودەدەن ئەتوانم عشق و خۆشەویستی بەر لە هاوسەرگیری

بە جۆرێك لە نەخۆشیەکی دەروونی کوشندە ناو ببەم وە زۆر جار دەبیستین لە زاری کچانەوە کە بۆ ئەم کارە دەکەن یەکسەر دەڵێن ئەی چۆن بتوانین

کەسێکی باش بدۆزینەوە بۆ هاوسەرگیری و بەم شێوەیە دەتوانین لە نزیکەوە تاقییان بکەینەوە ئەی باشە خا نمی بەڕێز تۆ ئەو شتانە بۆ خۆت

هەڵدەبژێریت کە بۆ تۆ گونجاون یاخود خودای گەورە ؟! هەست ناکەی ئەمە کاری تۆ نیە خانم گیان , پاشان تۆ باشتر دەتوانیت کەسی بەرامبەرت تاقی بکەیتەوە

و پرسیار لە خۆی و خێزانەکەی بکەیت یاخوت کەسانی لە خۆت گەورەتر و بە ئەزمونتر دەتوانن ئەمە بکەن وەك باوك و برا و خاڵ و مام هەتا دوای هەست ناکەی ئەمانە کاری تۆ نین ,

سەرنج بدەنە ژیانی ئەو پیرە پیاوە کە چۆن تەواوی ژیانی لەدەست چووە بە هۆی ئەو نەخۆشیەوە, ڕاستە لەکۆتایدا گەیشت بە کەسێکی دانا

و وەڵامێکی پڕ بە دڵی خۆی دەست کەوت بەڵام پاش چی ؟!!؟ پاش ئەوەی سەرجەم تاڵەکانی سەری سپی بوون , پاش ئەوەی کە هێندە چووەتە تەمەنەوە کە ناتوانێت

چیتر بە خواستی دڵی خۆی و بە لەبەر چاو گرتنی هەڵەکانی ڕابردووی جارێکی دیکە ئەزموونێك لە ژیانی هاوسەری تاقیبکاتەوە ,

بەڵام تۆی گەنج سەرەتای تەمەنتە ڕێگە مەدە ژیان

تووشی ئەو نەخۆشیەت بکات چونکە دەبێت ئەوە بزانیت

کە نەخۆشی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە هەندێك دەتوان لێی دەرباز بن بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێکیش پێی دەمرن , بۆ ئەوانەی کە دەمرن هیچ ئامۆژگاریەك بۆیان سوودمەند نیە

چونکە تازە تیرەکەیان لە کەوانەکە دەر چووە .

بۆ ئەوانەشی لێی دەرباز دەبن دەڵێم تەنها هەڵەی یەکەم مافی تۆیە , بۆیە ڕێگە مەدە ئاگرێك دوو جار بتسووتێنێت .

**پرسیاری دووەمی پیرە پیاوەکە ئەوەبوو کە کەسانی دیکەش هەن بەو ئەزموونەی ئەودا تێپەڕ دەبن ؟**

**بەڵی بە دڵنیایەوە ژیان بێ هەڵەش نابێت بۆیە**

**گەر تۆی گەنج تووشی بوویت نابێت بێ هیوا ببیت**

**لە ژیاندا بەڵکو وەك هەر جۆرە دەرد و نەخۆشیەکی دیکە**

**وەری بگرە و ورە بەرز ببە و باشترین ڕێگە چارە سەردانکردنی**

**دکتۆرانی بواری دەروونناسیە و ڕاویژکردنە لەگەڵیان و گوێڕایەڵی کردنی قسەکانیانە .**

**پرسیارێکی گرنگی ئەم پیرە پیاوە ئەوەبوو کە ئایا ئەو هاوسەرانەی لێك جیا نابنەوە فێری ئەوە بوون کە بەبێ بوونی خۆشەویستی بژین ؟**

**بە دڵنییایەوە نەخێر مەرج نیە ئەو خێزانانەی**

**کە لێك نەترازاون ئەوا راهاتبن بەوەی بەبێ خۆشەویستی**

**یاخود متمانە بژین بەڵکو هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەوان**

**لە سەرەتادا درکیان بەوە کرد و زانیان کە بۆچی هاوسەرگیری دەکەن**

و پاشان ئەو هەڵانەیان نەکردوە کە خێزانەکانی دیکە کردوویانە

پێش هاوسەرگیری بێت یاخود دوای هاوسەرگیری ,

پاشان ئەوانەی بەبێ خۆشەویستی و متمانە دەژین

ئەوا یان لەبەر قسە و لۆمەی کەسانی نزیك و کۆمەڵگایە

یاخود زۆرینەیان لەبەر ئەوەی تازە بوونەتە خاوەنی منداڵ و

نایانەوێت و ویژدانیان ئازاریان دەدات کە ئەو منداڵانە

سەرگەردان بکەن بەڵام من بەوان و بەتۆی گە نجیش دەڵێم : بەوە دەوترێت ژیان ؟ بەوە دەوترێت هاوسەرگیری ؟ یان ئەوە خۆفریودانە و ئەسڵەن ناتوانرێت ناوی هیچ جۆرە پەیوەندیەکی لێ بنرێت نەك هاوسەرگیریش .

( ئەوەندە بەتوندی خۆت وابەستەی هیچ عشقێك مەکە )

با لەنێوان پە نجەکانت ورد نەبێت و ئازارت پێ نەگەیەنێت

مەترسە لەوەی لەدەستی بدەیت

گەر خودا لە چارەنووسی تۆی نووسیبێت

ئەوا گەر تەواوی ئەم گەردوونە کۆببنەوە و دژی تۆ بوەستن

ناتوانن لێتی بستێنن ) .

## کاریگەری دروست کردنی پەیوەندی خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری

یەکەم : حەز و مەیلەکان ڕێگرن لەبەردەم ناسیندا

دووەم : لە خۆشەیستیدا ڕەفتارەکان رووکەشن

سێیەم : پێشنیاری هاوسەرگیری نیشانەی بۆچونێکی هەڵەیە

چوارەم : خیانەتکردن

پێنجەم : دروست بوون و فراوان بوونی بواری تاوان

شەشەم : دەرئە نجامی ناخۆش ( باری لار ناگاتە ماڵ )

حەوتەم : زیانەکانی کاتی خوێندن

هەشتەم : زیانەکان لە کار و پیشەدا

**نۆیەم : زیانە داراییەکان**

**دەیەم : پەستانی دەروونی**

**یازدەیەم : لەدەست دانی تواناکان**

**دوازدەیەم : لەدەست دانی سەرمایەی مەعنەوی**

**سیازدەیەم : بەفیڕۆدانی تەمەن و بەهەدەردانی لاویەتی**

**چواردەیەم : بۆچوونی خراپ و بەد گومانی لە کەسانی دیکە**

**پانزەیەم : کەم بوونەوەی خواستی کوڕان بۆ هاوسەرگیری و بەرزبوونەوەی تەمەنی کچان و مانەوەیان**

**شانزە : خۆشەویستیە درۆزنەکان دەگۆڕێن بۆ هەڕەشە و تۆڵە سەندنەوە .**

**گەر ئەم خۆشەویستیەی ئەم دوو گە نجە نەبێتە هۆکاری هاوسەرگییری کردنیان و لەیەکتری جیا ببنەوە ئەوا چەند ئە نجامێکی خرا پی بۆ هەردوو لایەن لیّ دەکەوێتەوە :**

**یەکەم : زیانی گەورە دەدات لە لایەنی سۆزداری مرۆڤ**

دووەم : خەمۆکی و ئالودەبوون بە ماددەی هۆشبەر

سێیەم : خۆکوشتن !

چوارەم : لەدەست دانی هەلی هاوسەرگیری

پێنجەم : ئازاری ویژدان

گەر ئەم خۆشەویستیەی ئەم دوو گە نجە ببێتە هۆکاری هاوسەرگیریان و لێك جودا نەبنەوە ئەوا چەند ئە نجامێکی خرا پی لێ دەکەوێتەوە :

یەکەم : درووست بوونی بەدگوومانی و نەمانی متمانە بە یەکتری

دووەم : برینداربوونی شکۆ و ناوبانگ

سێیەم : پیرۆزی ژیان دەکەوێتە ژێر مەترسییەوە

چوارەم : کاڵ بوونەوەی شکۆی هاوسەرگیری

پێنجەم : نەتوانینی دابینکردنی بەڵێنە درۆکان

## سیٚ تویٚژینەوە کراوە لە جیهاندا لەسەر درووست کردنی پەیوەندی خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری




یەکەم تویٚژینەوە کۆمەڵناسیٚکی بە ڕەگەز فەڕەنسی بوو بەناوی ( سۆڵ جۆردۆن ) کە دەڵیٚت :

لە سەدا 80 ی ئەو کەسانەی کە بە خۆشەویستی هاوسەرگیری دەکەن شکست دەهیٚنن !

ڕیٚژەیەکی کەم نیە هاوڕیٚ گیان وایە ؟!

دووەم تویٚژینەوە لە وڵاتی ئەمریکادا کرا کە کە دەلیٚت :

خۆشەویستی بەر لە هاوسەرگیری لە سەرەتادا لە لوتکەدایە ,

بەڵام کە چونە ژیانی هاوسەرگیریەوە وردە وردە ئەو خۆشەویستیە زۆر کەم دەبیٚتەوە یاخود هەر نامیٚنیٚت !

سیٚیەم تویٚژینەوە لەلایەن دکتۆرە نوری ئەلخرافی بوو

لە وڵاتی کوەیت کە تویٚژینەوەکەی لەسەر (90) حاڵەتی جیابوونەوەی هاوسەران بوو کە دەڵیٚ :

لە سەدا 50 ی ئەو حاڵەتانە ئەو کەسانە بوون کە

پیٚش هاوسەرگیریان پەیوەندی خۆشەویسییان لە نیٚواندا هەببوە !.







**لەم سەردەمەدا عشق و دڵداری زۆرێك لە كچانی شارەكەمی كردە لەشفرۆش ,  زۆرێكیش لە كوڕانی شارەكەمی كردە تاوانبار تا شوێنیان كوچەی زیندانەكان بێت**









**عیشق لە هەر شوێنێك دەوار هەڵبدات ئەوا شوێنی عەقڵ نییە**







( تۆی خوێنەر ئێستا سەرت دەسوڕمێت و دەڵێیت گەر پاڵنەری ئێمە بۆ هاوسەرگیری بۆ هەموو ئەو هۆکارانە نەبێت کە پێشتر باسمان کرد ئەی کەواتە چیە ؟! )




پێویستە تۆ سەرەتا سەرجەمی ئەو پاڵنەر و هۆکارانەی کە لە پێشتردا باسمان کرد کۆ بکەیتەوە لە یەك خاڵدا

و بتوانی هاوسەنگیەك لەنێوانیاندا ڕابگریت بە جۆرێك هیچ کامیان فەرامۆش نەکەیت

و بە تەواوی نەبەسترێیتەوە بە یەك خاڵیانەوە چونکە هەر یەکەیان گرنگی خۆی هەیە

, وە پاشان لەگەڵ ئەم هاوسەنگی ڕاگرتنەدا

پێویستە تۆ لە (پایەکان) و ( نهێنیەکان )ی هاوسەرگیری شارەزا بیت و لێیان تێبگەیت کە هەر یەکەیان بە شێوەی سەربەخۆ باس دەکەین .





**دكتۆر( ئەنوشە )ی فارس دەڵێت :**

**پایەكانی هاوسەرگیری دوو دانەن ,**

**یەكەم : خۆشەویستی , بەڵام خۆشەویستیەك دوای هاوسەرگیری كردن دروست بووبێت .**

**دووەم : متمانە .**

**وە هەروەها باس لە شەش حاڵەت و پەیوەندی نێوان ئەو خۆشەویستی و متمانەیە دەكات**

**كە چواریان ئاشكران و دەتوانرێت زوو ئە نجامی ئەو پەیوەندییەی كە هەیە دیاری بكرێت**

**كە هەر لە سەرەتاوە كۆتاییەكەیان ئاشكرایە بەڵام دووانیان كەمێك ئاڵۆزە !**

**یەكەمیان دەڵێت كاك دكتۆر بێ ئەندازە خۆشم دەوێت**

**و بێ ئەندازە متمانەم پێیەتی دكتۆریش دەڵێت هاوسەرگیری برۆ .**

**دووەمیان دەڵێت كاك دكتۆر نە خۆشم دەوێت و نە متمانەم پێی**

**هەیە دكتۆریش دەڵێت جیابوونەوە برۆ !**





**سێیەمیان دەڵێت کاک دکتۆر بێ ئەندازە خۆشم دەوێت بەڵام متمانەم پێی نیە**

**دکتۆریش دەڵێت جیابوونەوە برۆ !**

**چوارەمیان دەڵێت کاک دکتۆر بێ ئەندازە متمانەم پێی هەیە بەڵام خۆشم ناوێت**

**دکتۆریش دەڵیت جیابوونەوە برۆ !**

**ئەمانە ئاشکران بەڵام دوو حاڵەت هەیە لەژێر پرسیاردان ؟! :**

**یەکەمیان دەڵێت کاک دکتۆر لە بەهێزی ئەو خۆشەویستیەم بۆی متمانەم پێی هەیە .**

**دووەمیان دەڵێت کاک دکتۆر لە بەهێزی ئەو متمانەیەم بۆی خۆشم دەوێت .**

**دکتۆریش دەڵێت( بێگومان دەبێت ئەوە هاڵبژێریت کە لە بەهێزی ئەو متمانەیەی بۆی خۆشی دەوێت ) .**

## ( نهێنیەکانی سەرکەوتن لە ژیانی هاوسەریدا )




( پیشاندانی سوپاس گوزاری )

بە گوتنی وشەی سوپاس بە هاوسەرەکەت لەکاتێکدا کە چەند کارێك ئە نجام دەدات وەك

: کڕینی چە پکە گوڵ بۆت , یان هەر کارێکی دیکە کە ئەو پێی ماندوو ببێت

و تۆی پێ دڵ خۆش ببیت ,

چەند تویژینەوەیەك کراوە لەسەر ( 468) خێزان

لە ڕێگەی پەیوەندی تەلەفۆنیەوە دەرکەوتوە کە دەربڕینی سوپاس و پێزانین لەنێوان هاوسەران

بۆتە هۆی ئەوەی کەمتر لە هاوسەرانی دیکە توشی کێشە و فشاری خێزانی دەبنەوە .





**( داوای لێبوردن )**

**لەنێوان هاوسەراندا  پێویستە لێبوردەی هەبێت و داوای لێبوردن بکەن لەبەرامبەر هەڵەکانیان**

**, چونکە بە دڵنیایەوە لە ژیانی هاوسەریدا هاڵە تێگەیشتن هەر ڕوودەدات .**

**وە ئەمەش یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی ژیانی هاوسەری**

**, لەبەر ئەوە داننان بە هەڵەی خۆتدا واتای لاوازی تۆ ناگەیەنێت**

**بەڵکو ڕێژەی خۆشەویستی دەردەخات و زیادی دەکات**

**, وە زۆر گرنگە هاوسەران چاوپۆشی لە هەڵەی یەکتری بکەن .**

**( ڕاستگۆی )**

**باسکردن لەوەی کە هەستی پێ دەکەیت بەرامبەر هاوسەرەکەت بە ڕاستگۆی وەك**

**: ترس یان ئیرەی بردن یان هەست نەکردن بە دڵنیایی**

**ئەمەش یارمەتی ئەوە دەدات کە ڕووبەڕوی کێشەکان ببنەوە هەمیشە دەست لەناو دەست بن .**

**( زیندوو هێشتنەوەی یادگاریەکان )**

**پێویستە هاوسەران ئەو یادگاریانە بە زیندووی بهێڵنەوە کە**

**ژیانی هاوسەریان لەسەر پێك هێناوە بۆ ئەوەی ڕۆتینی ڕۆژانەی ژیانی پێ بشکێنن**

**و چەند کارێکی چێژ بەخش بە یەکەوە ئە نجام بدەن**

**وەك تەماشاکردنی فلمێکی سوود بەخش یان ئە نجامدانی گەشتێك .**





**( دەربڕینی خۆشەویستی )**

**بە بەکارهێنانی چەند ڕێگەیەکی زۆر سادە وەك**

**, بەکارهێنانی وشە و دەستەواژەیەك کە ئاماژە بێت بۆ خۆشەویستی**

**, یاخود کە هاوسەرەکەت لە ماڵ گەڕایەوە ماچی بکەیت**

**و هەر کات دەرفەتت بوو لە باوەشی بگریت تا هاوسەرەکەت هەر کات لە ماڵ ڕۆشتە دەرەوە تامەزرۆی گەڕانەوەی بێت لە بۆ لای هاوژینەکەی . هیچ کەسێکیش بەم کارانە نامرێت و لە کەسایەتی کەم ناکات تا بە لاتەوە قورس بێت .**





**( پێنج جۆر لە هاوسەرگیری کردن هەیە کە زۆر بە زووی و بە ئاسانی بڕیاری جیابوونەوەی لەسەر دەدرێت لەلایەن هاوسەرانەوە )؟؟؟**

**( پەیوەندی دووبارە لەگەڵ خۆشەویستی پێشوو )**

**( هاوسەرگیری بکەیت بە مەبەستی لەبیرکردنی عشق و خۆشەویستی پێشووت )**

**( هاوسەرگیری بەهیوای گۆڕانکاری )**

**( هاوسەرگیری بە زۆرلێکردن جا ئەو زۆر لێکردنە لەلایەن هەر کەسێکەوە بێت )**

**( هاوسەرگیری بکەیت بەهیوای ئەوەی کە هاوسەرەکەت هەموو ئەو مەرجانەی تێدا بێت کە تۆ دەتەوێت)**

# چەند ئامۆژگاریەکی گرنگ

هاوسەرگیری ئامانج نیە ؛. گەر کەسێکت بە ئامانج و بە خاڵی کۆتای

داناوە ئەوا زۆر هەڵەیت



هیچ کات بڕیارە گرنگەکان بەتەنها مەدە بهێڵە هاوسەرەکەت یارمەتیت بدات تا دواتر لۆمەت نەکات





بەنیاز نەبیت خۆشبەختی بە کۆمەڵگاگەتەوە ببینیت تەنها ئەو کاتە نەبێت کە خۆت و هاوسەرەکەت خۆشبەخت بن







**پێویستە بایەخێکی باش بدەیت بە هاوسەرەکەت نابێت هیچ کات هەست بە بێ تۆی بکات تەنانەت لەو کاتانەشی کە لەلای نیت !**

**تەنهاو تەنها بەدەستی هاوسەرەکان خۆیانە کە ژیان بکەن بە دۆزەخی عەشق یاخود بە باخی عەشق**



سەرەتا دەبێت خۆت بناسیت پاشان هاوسەرەکەت





( هیچ کات هەوڵ مەدە لە ڕووی سۆزداریەوە هاوسەرەکەت بجوڵێنیت و بگریت تا کارێکت بۆ بکات ! چونکە لەو کاتەدا پیاوان وا هەست دەکەن کە بەکاریان دەهێنیت و یاریان پێ دەکەیت )







**گەر لەڕێی وشکانیەوە گەشتت کرد ئەوا دوو جار بیر بکەرەوە , گەر لە ڕێی دەریایەوە گەشتت کرد سێ جار بیر بکەرەوە , بەڵام گەر هاوسەرگیریت کرد سەد جار بیر بکەرەوە**

**ئاگاداری هەست و سۆز و خۆشەویستی و کات و هێزت بە کە کێ بە شایەنی دەزانیت و تێیدا سەرفی دەکەیت , چونکە تەواوی سەرمایەی تۆ لەم دوو شتەدان**

**هیچ ڕێسا و یاسایەك لە ژیانی هاوسەریدا بوونی نیە !, مەگەر ئەوەی کە خودی هاوسەرەکان درووستیان کردبێت**

**بەبێ متمانە ناکرێت بەردەوام ببیت, مرۆڤەکان ناتوانن متمانە نەکەن بەڵام پێکەوە بژین , گەر منداڵت هەیە و دەڵێت لە پێناو ئەواندا بەردەوام دەبم ئەوا خۆت دەفەوتێنیت**



**هەرگیز زۆر لە ڕابردووی ئەو کەسە مەکۆڵەرەوە کە بەنیازی هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەیت , جوانترین گوڵیش بنی هەڵبکۆڵیت لانی کەم کرمێك هەر دەدۆزیتەوە**





**هاوسەران تەواوکەری یەکتری نین ! بەڵکو پاڵپشت و بەهێزکەری یەکترن**









**هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسەدا مەکە کە دەتوانی لەگەڵی بژیت ،**

**هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسەدا بکە کە ناتوانی بەبێ ئەو بژیت**





**هاوسەرگیری مانای ئەوە ناگەیەنێت کە هەرچیتان هەیە لەنێوانتاندا دابەشی بکەن , بەڵکو دەبێت هەرچیتان هەیە دەبێت بیبەخشن بە یەکتری**









**هەمیشە لەکاتی گفتوگۆ کردن لەگەڵ هاوسەرەکەت**

**یاسای 10 چرکەی جێبەجێ بکە**

**بە شێوەیەك کە هەر جارێك نیازی قسە کردنت هەبوو**

**ئەوا 10 چرکە بیر لەو قسەیە بکەرەوە کە بەنیازیت بیڵێیت .**

**ئایا دەزانی ؟ لە ( ڤێتنام ) گەر کەسێك بیەوێت هاوسەرگیری بکات پێویستە سەرەتا بە ڕاپۆرتی پزیشکی بیسەلمێنێت کە بەتەواوی هێزی ئەقڵیەوە بڕیاری ئەم هاوسەرگیرییەی داوە نەك بەهۆی کەم ئەقڵییەوە , چونکە پێیان وایە هاوسەرگیری بەرپرسیاریەتیەکی گەورەیە و سەرەتا پێویستی بە ئەقڵە.**







**هاوسەرگیری دەرمانی هیچ دەردێك ناكات ! وەك خواردنە نەك دەرمان**

**هاوسەرگیری گرەنتی ئەوەت ناكات كە تۆ تا سەر لەگەڵ ئەو كەسەدا بمێنیتەوە !, بەڵكو ئەوەی تا سەر دەمێنێتەوە بریتیە لە ڕێز و خۆشەویستی و وەفاداری**

## ( وەڵامی چەند  پرسیاری گرنگ  )




1 . من دوای خوێندنەوەی ئەم بابەتە دڵنیا بوومەوە کە خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری کارێکی هەڵەیە . بەڵام راستیەکەی ئەوە نزیکەی هەشت مانگە  پەیوەندی خۆشەویستیم لەگەڵ کچێك هەیە , هەرچەندە دەزانم کە ئەوە کارێکی هەڵەیە بەڵام ناتوانم دەست بەرداری ببم و ئەو پەیوەندیە بپچڕێنم , چی بکەم ؟

وەڵام : ئەوەی نوسیوتە نیشانەی ڕۆحی ڕاستگۆی و حەقبێژی تۆیە , بەڵام پێویستە مەودای قسە و کردار ببڕیت . لە ڕاستیدا تۆ خۆت ئەوەت لا پەسەندە تەنیا ئەوەت ماوە کردەوەی  پێبکەیت , چونکە مرۆڤ کاتێك باوەڕی بە باشی کردنی کارێك  یان وازهێنان لەو کارە هەبوو ئیتر پێویستە هەنگاوی کرداری بۆ بنێت . بە هەر نرخێك بێت پێویستە خۆی ناچار بکات بە ئە نجامدانی وە دەبێت ئامادەی ئەوەت تیا بێت کە قوربانی بۆ بدەیت .

بۆ سەرکەوتنیشت بەسەر ئەو بڕیارە پێویستە ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بکەیت :





یەکەم . پەیوەندیەکە بە تەواوی و لە سەداسەد بپچڕێنە , دوای مەخە ئێستا بیکە .

مەڵێ خۆ هیچ نابێت گەر مانگی جارێ قسەی لەگەڵ بکەم ؟

نەخێر , زۆر شت دەبێت , نابێت هیچ کوێرە ڕێگایەك بمێنێتەوە کە ئەگەری دووبارە بەستنەوەی ئێوەی بە یەکەوە تێدا بێت ئیمە نالێین کەمی بکەرەوە هاوڕێ گیان دەڵێین کۆتای پێ بهێنە .

دووەم . گەر هەر شتێکی ئەوت لایە , نامە , دیاری , هەر یادگاریەك , بەبێ دوودڵی لەناوی ببە و نەهێڵیت بکەویتە ژێر کاریگری هەست و سۆزەکانتەوە و بە شتێکی بەنرخ دایبنێیت .

سێیەم . ئەگەری بینینی ئەو بۆ لە سەدا ژێر سفر لە مێشکی خۆت کەم بکەرەوە .

چوارەم . بیری لێ مەکەرەوە , گەرچی لەوانەیە ڕۆێك لە ڕۆژان لەناکاو بکەوێتەوە خەیاڵتەوە , بەڵام تۆ وەك ئەو کەسە بیری لێ بکەرەوە کە باوك یان دایك یان کەسێکی نزیکی مردووە و گەر بێتەوە یادیشی هیچ لە مەسەلە ناگۆڕێت . یاخود ڕاستەوخۆ خۆت سەرقاڵ بکە بە کارێکەوە یان بچۆرە دەرەوە بۆ پیاسەیەك لەگەڵ هاوڕێیەکت , یان وەرزش بکە .

پێنجەم . نوێژەکانت لە کاتی خۆید بکە بە تایبەت نوێژی بەیانیان و چەند خولەکێك لەگەڵ خوای خۆت نزاو وتووێژ بکە و داوای ڕێنوێنی لێ بکە .

2. من دەمەوێت پەیوەندیەکە بپچڕێنم . بەڵام دڵم بۆی دەسووتێت لەبەرئەوەی منی زۆر خۆش دەوێت و منیش هەندێ بەڵێنم پێی داوە و باوەڕم وایە کە وازلێهێنانی نامەردیە ! , هەروەها دەترسم بە بیستنی ئەم بابەتە زۆر دڵتەنگ ببێت کاری هەڵە بکات و خۆی بکوژێت یان بەتەواوی دەروونی بڕوخێت . ئایا ئەمانە لە داهاتودا کاریگەری خرا پی نابێت لەسەر ژیانم ؟

وەڵام : ئەوەت لەیاد بێت نابێت هەرگیز بڕیارەکانت لە ژێر کاریگەری هەست و سۆزەکانتا بدەیت بۆ هەموو کاتێك و لەم کاتەشدا بەتایبەتی و وە نابێت بە هەڕەشەی خۆکوشتن و گریان و ئەمانە تۆ بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و تۆ لەو بڕیارە سارد بکاتەوە , گەر هەر شتێکیش ڕووبدات تۆ بەرپرس نیت .

3. من پێشتر لەگەڵ کچانێکی زۆردا پەیوەندیم هەبووە هەندێکات بەڵێنی هاوسەرگیریشم بە هەندێکیان دەدا بە چەشنێك یاریم بە هەست و سۆزیان دەکرد وە ئێستا هەموو ئەو پەیوەندیانەم پچڕاندوە

**بەلاّم ئێستا هەست بە تاوانی زۆر گەورە و تورەبوونی خودا دەکەم وە نازانم چکارێك ئەنجام بدەم ؟**

**وەڵام : کار بەم هەنگاوانە بکە و نیگەران مەبە**

**یەکەم . بە راشکاوی و ڕاستگۆی داوای لیچخۆشبوون لە خوودا بکە.**

**دووەم . ئەگەر دەتوانیت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەوڵبدە بواری گۆڕانکاریان بۆ برەخسێنیت ئەویش لە ڕێگەی خولێکی دەروناسی یاخوود سیدیەك یاخود ناردنی ئەم پەرتووکە و هاوشێوەکانی ئەم پەرتووکە بەڵام ئەوە بزانە کە دەبێت بەتەواوی نهێنی و ناڕاستەوخۆ بێت و وە نەزانرێت کە ئەو کارە لەلایەنی تۆوە بووە بۆئەوەی مەترسی دووبارە درووست بوونەوەی پەیوەندیەکەتان نەیەتە ئاراوە .**

**سێیەم . نزای زۆریان بۆ بکەن بۆ ئاسوودە بوونیان , گۆڕانکاریان , چیتان لەدەست دێت بیکەن بۆ ئەوانەی لە ڕووی سۆزداریەوە ئازارتان داون , وەك , خێر و نوێژ و حەج ........**

## پاڵنەری دینی




هەموو شتێكمان بە ناوی خودا دەست پێ دەكەین , لە پێناو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو هەموو هەنگاوێك دەنێین , هاوسەرگیری كرد نمان و پێكهێنانیماڵمان و هێنانە دوونیای منداڵ و پەروەردە كردنیان دەبێت هەمووی بۆ خوودا بێت , كەوایە بەر لەدەست كردن بە پێكهینانی ژیانی هاوسەری پێویستە ڕووت بكەیتە ئاسمان و بە خودای خۆت بلێیت , خودایە ئەوە من لە بەر تۆ و پشت بە تۆ و داوای یارمەتی لە تۆ هاوسەرگیری دەكەم .

## پاڵنەری كۆمەڵایەتی




مرۆڤی ژیر بیر لەوە دەكاتەوە كە كەسایەتی تایبەت بە خۆی بۆ درووست بێت و ماڵی هەبێت و منداڵی هەبێت و لە ناو خەڵكیدا پاییەكی كۆمەڵیەتی تایبەت بە خۆی هەبێت .

## پاڵنەری جنسی





ئەو پاڵنەرەی کە هۆکاری ئاوەدانی و بوونی ئێمەیە لەسەر زەویدا و نابێت پشتگوێ بخرێت , چونکە گەر پشتگوێ بخرێت بۆشایەکی گەورە لە لایەنی سۆزداریەوە درووست دەبێت لە دڵ و دەروونی هەردوو ڕەگەزدا و تووشی دەردە کەورەکەی ژیانی هاوسەری دەبن کە خیانەتە .

## پاڵنەری دەروونی

ئەو خۆشەویستی و سۆز و بەزەییەی کە لە ژیانی هاوسەریدا دروووست دەبێت دەبێتە مایەی سەلامەتی دەروونی بۆ ئەو خێزانە . کاتێك کە نیازی ئەوەت هەیە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێك بکەیت گەر بۆت دەرکەوت ئارامی دەروونیت پێ نابەخشێت ئەوا هەرچی زوترە دەست بەرداری ئەو کەسە ببە , چونکە هەر کارێك لەم ژیانەدا کە تۆ دەیکەیت گەر ئارامی دەروونی پێ نەبەخشیت ئەوا هیچ سوودی نییە .

## پاڵنەری خۆشەویستی

خۆشەویستی وادەکات کە هاوسەرەکەت هەموو ڕۆژێکی لە ڕۆژێکی دیکە جوانتر بێت ئەوە خۆشەویستیە کە وادەکات دووژمنانت نەتوانن زەفەرت

پێ بەرن لەبیری نەکەیت ئەو خۆشەویستییەی کە تۆ نایدەی بە هاوسەرەکەت کەسی دیکە زۆرە کە شوێنی تۆ پڕبکاتەوە و ماڵت وێران بکات ئەوەشت لەبیر بێت کە گورگی برسی زۆرە , گەر خۆشەویستی لەنێوان هاوسەراندا نەبوو واتە هیچ ! لە کاتی دەستگیرانداریدا بە چەندەها کاتژمێر قسەی فەلسەفی و خۆشەویستی بۆ یەکتری دەکەن بەڵام کە ڕۆشتنە ژێر سەقفی یەك خانوو وەك ئاژەڵ تەماشای یەکتری دەکەن ! کێ ئەم ڕێگایەی نیشانی تۆ دا ؟ بەر لە هاوسەرگیری هاتیت بزانیت بۆ هاوسەرگیری دەکەیت ؟! پرسیار لە محمد پەیامبەری ئیسلام کرا کە کێ لە هەموو کەس لەلات خۆشەویسترە وتی عائیشەی خێزانم

.

## پاڵنەری دایکایەتی و باوکایەتیە





زۆرێك لە مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەوی بە ئاواتی ئەوەن کەسانێك لە چواردەوریان هەبێت کە بە دایە و بابە بانگیان لێبکەن بەڵام ئێمە نایەین ورد بینەوە لە هۆکار و پاڵنەرەکانی هاوسەرگیری بۆیە کە ڕوو بەڕووی واقیعەکە بووینەوە سەری لێ دەر ناکەین , کە تۆ زانیت یەکێك لە واقعەکانی ژیانی هاوسەری ئەوەیە کە منداڵت هەبێت





ئەوكات لەوەش تێدەگەیت کە بۆچی منداڵ دەهێنیتە ژیانی هاوسەریتەوە .

## ڕزگاربوونە لە تەنیایی




گۆشەگیری لە ژیاندا بۆ هیچ کەس ناچێتە سەر , هەموو مرۆڤێك کاتێك قۆناغەکانی ژیانی دەبڕێت پێش کۆتا قۆناغی و کۆتا قۆناغیش چەن هەستێکی خۆشە کە هاودەمێکی هەبێت , چەندە گرنگە بۆ سەرەتای گە نجی دوو هێندە گرنگە بۆ پێش ماڵ ئاوای کردن لە ژیان کە کەسێك هەیە لێت تێ دەگات , کەسێك هەیە لە واتای پیری و کۆمەڵێ ڕوداو تێدەگات کە کەسانی چواردەور و منداڵەکانت لەو واتایە تێ ناگەن ئەوانە بۆیەك درووست بوون دەبێت بەیەکەوە بن تەنانەت لە بەهەشتی خودای گەورەشدا هیچ کەسێك نیە کە هاوسەرگیری نەکردبێت .





## بەرەو سەربەخۆبوون




زۆر جار گوێمان لێ دەبێت کە گە نجێك دەڵێت هەرکات هاوسەرگیریم کرد وا دەکەم و وا دەکەم, یاخود باوکێك بە منداڵەکەی دەڵێت هەر کات خۆت هاوسەرگیریت کرد چی دەکەیت بیکە , ئەم جۆرە لە ئازاد بوون و سەربەخۆ بوونە لە ناخی هەموو کەسێکدا هەیە . کاتێك کەسێك دەبینێت کە باوکی لەگەڵ دایکیدا زۆر بە خرا پی مامەڵە دەکات یاخود بە پێچەوانەوە , یەکسەر دەڵێت وەڵاهی من هاوسەرگیری بکەم دەبێت بە باشترین شێوە لەگەڵ هاوسەرەکەم ڕەفتار بکەم کەواتە بەم سەربەخۆ بوونە مرۆڤ ئەو پەیامە جوانانە دەگەیەنێت و ئەو شتانەی کە باشن تۆخیان دەکەمەوە وە مرۆڤ کە سەربەخۆ دەبێت نابێت هەڵەکانی چواردەوری دووبارە بکاتەوە .





## کامڵ بوونی پیاو و ئافرەتە




هەرکاتێك هێز و سۆز یەکیان گرت ئەوا ڕووخاندنیان گەر محاڵیش نەبێت ئەوا قورسە, هێز و پیا و سۆزی ئافرەت , بەڵام گەر ئەو دوو سیفەتە یەکیان نەگرت ئەوا زۆرێك لە ئاوتەکان لەناو دەچن , لەبەر ئەمەیە وتراوە لە پشت هەموو پیاوێکی سەرکەوتوو خا نمێکی بە سۆز هەیە . گەر باخەوان بە سۆز و خە مخۆر بوو ئەوا گووڵ هەمیشە دەدرەوشێتەوە .





وەرن با بەڵێن بدەین سەرەتا خۆمان کەسێکی بەختەوەر بین واتە لە خۆمانەوە دەست پێبکەین تاوەکو کۆمەڵگاکەمان ببێتە کۆمەڵگایەکی بەختەوەر دەبێت لەوە دڵنیا بن کە ئەمە بەدەستی من و ئێوەیە .

دڵێکی شاد و لێوێکی پڕ لەخەندە بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵگا ،

سەرکەوتوو بن .

کۆتایی هات بە پشتیوانی پەروەردگاری مەزن

بۆ هەر سەرنج و رەخنەییێک پەیوەندی بکەن بە ژمارەی ڤایبەر و تلگرامی نوسەر

٠٧٧٠ ٧٣٤ ٩١٤١

- هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسە دا مەکە کە دەتوانیت لەگەڵی بژیت ،
هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسەدا بکە کە ناتوانیت بێ ئەو بژیت .

- هیچ ڕێسا و یاسایێک لە ژیانی هاوسەریدا بوونی نیە ،
مەگەر تەنها ئەوە نەبێت کە هاوسەران خۆیان دروستی دەکەن .

- هاوسەرگیری ئامانج نیە ،
گەر کەسێکت بە ئامانج و خاڵی کۆتا داناوە ئەوە زۆر هەڵەیت .